


# پەندو وتەکانی

# "خاڵۆ"



ئامادەکردنی:

سەلمان شارەزوری

چاپی سێیەم






# پەندو وتەکانی خاڵۆ

وەرگێڕانی: سەلمان شارەزوری

پێداچوونەوە: سیروان سلێمان

# خالۆ ڕامیز کێیە؟

## TUNCEL TAYANÇ KURTIZ

تونجێل تایناچ کورتیز

(١-٢٠١٣ - ٢٧/١٩٣٦)

شانۆکار و ئەکتەر و نوسەر و دەرهێنەری تورک لە ساڵی ١٩٦٤ەوە دەستی بە ئیشی هونەری کردووە، لە زیاتر لە ٧٠ فیلم ڕۆڵی گێڕاوە، کە هەندێکیان هی وڵاتانی دیکەش بووە.

تونجێل کورتیز لە Bahçecik سەربە kocaeli کە شارێکی تورکیایە لەدایک بووە، باوکی قایمقامی شـارەکـە بـووە و



دایکیشی خەڵکی بۆسنە بووە و پیشەی مامۆستا بووە. وە بەهۆی خێزانەکەیەوە وای خواستووە شوێنی زۆر گـەڕاون لـە وڵاتـەکـە، دوای ئـەوە دواناوەندی حەیدەر پاشای لە ئیستەنبوڵ تەواو کردووە و دواتر بەشی فیلۆلۆجی لە زمانی ئینگلیزی خوێندووە لە زانکۆی ئیستەنبوڵ.

## سەرەتای کاری هونەری

سەرەتای کاری هونەری لە شانۆوە دەست پێ کردووە، تا ساڵی ١٩٥٨ چەندین شانۆیی پێشکەش کرد لە ئیستەنبوڵ، وە هەروەها لە هەرێمەکانی دیکە و ستەیجە تایبەتەکان.هەروەها لە شاری ستۆکهۆڵم و سوید و بەرلین و هامبۆرگ و بەریتانیاش هەیبووە.

لەوکاتەی لە زانکۆ بووە و دوای ئـەوەش کەلە سـەربـازی بـووە بە هاوڕێیەتی دەرهێنەری بەناوبانگی تورکی یەڵماز گونـەی، پێکەوە چەند فیلمێکیان بەرهەم هێناوە و



لە چەندین وڵاتی جیاواز کاری کردووە.

تونجێل کورتیز لە تەمەنی ٧٧ ساڵی و لە ٢٧، September ی ساڵی ٢٠١٣ کۆچی دوایی کردووە لە ئیستەنبوڵ.

لە دیارترین کارەکانی تونجێل کورتیز کە ڕۆڵی لە چەندین فیلم دیوە و چەندین فیلم و درامای بەرهەم هێناوە و ڕۆڵی تێدا گێراوە، بەڵام لێرەدا باسی یەکێک لە دراماکانی ئەکەین کە بووە هۆی ناوبانگێکی زۆر، ئەویش درامای Ezel بوو کە لە ساڵی ٢٠٠٩ دەرچوو، کە بە ڕۆڵی ramiz dayı یان خاڵۆ ڕامیز ناوبانگێکی زۆری دەرکرد، کە بە وتە بەنرخ و واتا دارەکانی دراماکەی زیاتر خستە بەر دڵی بینەران و بووە هۆی ئەوەی زیاتر و زیاتر ناوبانگ دەربکات.



لەبیری مەکە!
هەزار جار بگەڕێیتەوە ئەو ڕۆژە
هەزار جار خیانەتت لێ ئەکاتەوە
هەموو کەس ئەوە ئەکات کە لە سروشتیایەتی
گەر هەزار جار خیانەت لەتۆ بکەن
چارەی نیە هەزار جار ئەگەڕێیتەوە لایان.

* * *

تۆڵەسەندنەوە ژیان ئەیسێنێ
تۆ هەر پێی نازانی.

* * *

هەتا نەتوانی خۆت بەدەستەوە
بدەی ناتوانی دڵسۆز بیت.

* * *



گەر شتێک ڕوو نەدات، ئەوە یان لەبەر ئەوەیە کەباشتر دێت، یان بەڕاستی لەبەر ئەوەی پێویست بووە نەبێت، بۆیە نەبووە.

❋ ❋ ❋

ئەگەر خەوت لێ نەکەوت چاوەکانت تاوانبار مەکە، لەوانەیە ئەو خەونەی چاوەڕێی دەکەی ئەوە نەبێت.

❋ ❋ ❋

بگەڕێوە و سەیری دوای خۆت بکە، بزانە چەند کەس پێت دەڵێ نابێت بڕۆیت؟

❋ ❋ ❋



هەمیشە کۆتا قسەکان وەربگرن
پێشینانمان وا دەڵێن.

* * *

نیگـای ئـازاکـان زۆر تـیـژتـرە لـە شمشێری
ترسنۆکەکان.

* * *

دڵـسـۆزی یـان بـەرەو کەسێک ڕادەکـات یان
لەکەسێک ڕادەکات.

* * *



گۆڕان زۆر قورسە، بەڵام هەندێ
جار بوونەوە بە هەمان کەس زۆر
قورسترە.

* * *

لە کۆتایی یارییەکەدا، زۆر ماندوو بووی بەهۆی ئەوەی پێویست بوو لە شوێنی خۆت بیت.

* * *

تۆ بە گریانەوە هاتیتە دونیا، پێتوابوو ژیانێکی پڕ پێکەنینت ئەبێت؟

* * *

با بخۆینەوە، لەبەر ئەو عەشقە نا کە قەدەر بۆی هێناین، بۆ ئەو عەشقەی قەدەرەکەمانی گۆڕی.

* * *



چەندی دەتەوێ بگۆڕێ، بەڵام لەکۆتایدا لەکوێ دڵخۆشبووی بەرەو ئەولایە دەڕۆی.

* * *

نەمتوانی هەندێک لە مرۆڤەکان بدۆزمەوە
هی ئـەوە بـوو مرۆڤەکان دوور بـوون، یـان لە مرۆڤایەتی دوور بوون؟

* * *

دڵسۆزی!
یان بەرەو کەسێک ڕادەکات،
یان لەکەسێک ڕادەکات.



هاوڕێیەتی وەک مردن وایە،
هەر کە سنورەکەت تێپەڕاند! گەڕانەوەی نیە.

❊ ❊ ❊

لەبیرت بێت!
ڕۆشتنی کەسێک کە شایەنی تۆ نەبووە
بە نیعمەتی بزانە، نەک کارەسات.

❊ ❊ ❊

کوڕم، من تێناگەم
لەکاتێکدا پێویستە کاربکەیت لە پێناو
مافەکانمان، بۆ ئاینەکەمان، بۆ دەوڵەتمان،
تێناگەم چۆن
دەتوانی شەوان خۆت بە گوناهەوە
سەرقاڵ بکەیت.



❊ ❊ ❊

کەسێک بـاوەڕی بە قـەدەر هەبێ بـاوەڕی بە ڕێکەوت نیە،کەسێکیش باوەڕی بە ڕێکەوت هەیە ناتوانێ قەدەری خۆی لە دەستی خۆیا بهێڵێتەوە.

* * *

گەر دەتەوێت بگەی بە لوتکە، هەرگیز خاڵێک دامەنێ، هەمیشە ڕاستە هێڵێک بکێشە و شەوانە درێژی بکەوە و ڕۆژانە کاری بۆ بکە، چونکە لوتکە هەرگیز خاڵێک نیە کۆتای بێت، بەڵکو ڕاستە هێڵێکە هەر دەڕوات، گەر بەدوای کەوتی ئەو کات تۆ لە لوتکەی.

* * *



گومان وەک ژەهـر وایـە، بچێتە نـاخی هـەر کـەسێکـەوە هـەمـوو شتێک وێران دەکات.

* * *

ئەو ڕۆژانەی بە پێکەنین بردمانەسەر بە گریانیش نایەتەوە.

* * *

هەرگیز ڕامەوەستە...

* * *

لەکوێ پچڕا لەوێ بە یەکدی گرێی دەوە!

* * *

گەر من نەسوتێم و تۆ نەسوتێی و ئەوان نەسوتێن، ئەوا چۆن بەسەر تاریکیدا زاڵ دەبین.

* * *



مەرگ یەکجار نایەت، چونکە هەریەکە لە ئێمە ڕۆژی چەند جار دەمرین، هەرجار کە ماڵئاوایی لە ئارەزوویەک یان پەیوەندیەک دەکەین، دەمرین.

* * *

هەمیشە چاوە لاوازەکان بەرامبەر بە تیشکە بەهێزەکان هەڵنایەن.

* * *

هەموو کەسێ نهێنییەکی هەیە ناتوانێ بە کەسی بڵێت، وە هەموو کەسێک ڕوخسارێکی هەیە پیشانی کەسی نەداوە.

* * *



گەڕانەوە بۆ ڕابردوو شتێکە و سڕینەوەی ڕابردوو شتێکی تر، ئاو جارێک کە دەڕژێ ڕێڕەوی خۆی وەر ئەگرێت و نایگۆڕێت.

* * *

هەندێ جار بۆ ئەوەی بژین پێویستە بکوژین، بۆ ئەوەی ئەو خۆشەویستییەی لە ناختایە نەتکوژێ، پێویستە تۆ بیکوژی.

* * *

یاسای ژیان ئاوایە، چەنێک دوور ئەتەوێ برۆ، لە کۆتاییدا ئەگەڕێیتەوە خالی دەستپێک.

* * *



.چیت دەوێ بیکە، تۆ نایبەیتەوە، هەر دەدۆڕێی، چونکە، لەسەرەتای کارەکە تۆ دۆڕاندوتە.

* * *

.

هەندێ جار ژیان ئەوەندە قورس ئەبێت لەسەرت لە ڕێگاکەتدا بیرت ئەچێتەوە کە کێیت.

* * *

.

ئەگەر مرۆڤ تەنها هەوڵی خۆشویستنی مریشکی دا، ڕۆژێک دێ برسی ئەمێنێتەوە.

* * *



ئێمە زۆر لە نزیکەوە سەیری خۆشەویستەکانمان
ئەکەین
بۆیە کەموکورییەکانیان نابینین.

* * *

بەڵێن ئەدرێت و بەڵێنیش ئەشکێنرێ،
بەڵام ڕۆژێک دێ خیانەتکار داوای وەفا ئەکات.

* * *

مرۆڤەکان هەندێ جار پێویستە بشکێنرێن،
بۆ ئەوەی کە بزانن چ جۆرە کەسێکن.

* * *



من زانیم بە بێ هودە کاتم بە فیڕۆ دا، کاتێک زانیم تۆ سواری کەشتییەکی دیکە بووی.

*** 

هەندێ جار لە مرۆڤەکان خۆشدەبیت، چونکە دەتەوێ ئەوان لە ژیانت بمێننەوە.

***

مردن هەر ڕۆیشتنێک نیە و دەرچوونی گیانێک نیە.

***



گەورەترین هاورێکان ئەبنە گەورەترین دوژمن.

* * *

ڕێگاچارەیەکی تر هەیە-

مەبەستت مردنە ؟-

* * *

چوار هاورێی ڕاستییت هەبێ بەسە، ئەوانیش بۆ ئەوەی تابوتەکەت هەڵبگرن.

* * *

ئـەو کـەسـەی ئـازاری کێشاوە هەرگیز ئەو کەسەی پێشوو نیە.

* * *



لەبیرت بێ مرۆڤ پارەی ساختە دروست ئەکات، پارەش مرۆڤی ساختە.

*** 

گەورەترین بەدبەختی ئەوکاتەیە کە ئەڵێی ئەوەی لەدەستم هات کردم.

*** 

نیگـەران مـەبـە، هـەمـوو مـرۆڤـەکـان دەمـرن، هەندێکیان لە ناو خاکا نێژراون، هەندێکیان لە ناو دڵدا.

***

لـەگـەڵ کـێ پێکەنیت لـەوانـەیـە لەبیری بکـەی، بـەڵام لـەگـەڵ کێ گریاوی قەت لەبیری ناکەی.

***



.پارەت هەبێ مرۆڤەکان تۆ ئەناسن، بەڵام کە پارەت نەبوو تۆ ئەوان ئەناسی.

* * *

مەراق زۆر لە عەشق بەهێزترە.
کاتێک بۆ یەکەم جار عاشق ئەبی، ئەوە ئەزانی عاشق بویت و ئەزانی کە عەشق چیت لێ ئەکا، بەڵام مەراق وانیە، ئەگەر مەراقی کەسێک بکەی ئەو مەراقە دەتهێنێت و دەتبات.

* * *

ئەوین بە دوای قەدەرا ئەڕوات یان قەدەر بە دوای ئەوینا؟ تا ئێستا کەس ئەو مەتەڵەی نەزانیوە!

* * *



لەبەر ئەوەی ئەم دونیایە ڕۆژێک دێ کۆتایی دێ، ئیتر بۆ کۆتایی هاتنی خۆشەویستی بۆ خەفەت بخۆین؟

* * *

..

کوفر بۆ شەیتان کراوە و تۆبەش بۆ ئینسان. عەشقیش لە ئافرەت جوانە و خۆشەویستیش لە پیاو.

* * *

.

لێخۆشبوون لە دوژمن ئاسانە، ئەوەی قورسە لێخۆشبوونە لە هاوڕێ.

* * *



مرۆڤ هەرچەندە بە بەزەیی بێت، ئەوە زیاتر لە مەترسیدایە.

❊ ❊ ❊

ئەگەر کەسێک فێڵی لەتۆ کرد
ئەوە هەڵەی ئەوە،
بەڵام گەر ئەو کەسە زیاتر لە جارێک فێڵی لەتۆ کرد ئەوکات خەتای تۆیە.

❊ ❊ ❊

دوژمـن نیشانەشکێنێکی کوێرە، بەڵام دۆست ئەزانێ لە کوێت ئەیات.

❊ ❊ ❊



بۆ پاراستنی خۆشەویستەکەت  لە شەڕێکی بێ کۆتا بێ،
تاریکترین و قورسترین ڕێگا چارە ئەوەیە بیکوژیت،
وە بۆ ڕزگارکردنی خۆشەویستەکەت خراپترین ڕێگا چارە ئەوەیە خیانەتی لێ بکەی.

* * *

لەبەر ئەوەی لێخۆشبوون مانای لەبیرکرنە،
سەرەتا  ئەتەوێ بیرتبکەوێتەوە و دواتر لەبیری ئەکەیت.

* * *



ئیتر هیچ شتێک هەڵنابژێرم،
ئەبێ لە هەموو شوێنێک بیت.

* * *

ئەگەر هەموو شتێ بەو ڕێگایە بڕوا خوێنت تیا ڕشتووە، یان بە یەک لێدان ئیشەکەت گەیشتە کۆتایی کاتێک ئەگەیتە کۆتایی ئەبینی زۆربەی ئەو شوێنانەی ئەتویست بۆی بچی نەماون.

* * *

هەموو شتێک کە لە ناخت ئەیهێڵیتەوە
وەک و فیشەکی لێدێ،
ئەوانەی خۆشەویستەکانیان
کوشتووە لەمە چاک تێ ئەگەن.



* * *

تۆ لەبەر خۆت سواڵ ئەکەیت و ئەپاڕێیتەوە، من لەبەر خۆشەویستەکانم.

❊ ❊ ❊

لە کۆتایی یارییەکەدا هەر ڕێگایەک کۆتاییەکی جیاوازی هەیە.

❊ ❊ ❊

کاتێک هیچ شتێک نەماوە بیکەی، باشترین شت ئەوەیە هیچ نەکەیت.

❊ ❊ ❊



ئەو کەسەی ئەو وانە خوێناوییە وەر ئەگرێت کە ئەیڵێینەوە،
دێت و ئەو وانەیەی فێربووە پێمان ئەیاتەوە.

*** 

تۆ پیاوەکانت فێری کوشتن کرد، منیشت فێری مردن.

***

دەستی ڕاست و دروست و بێ شکست ئەو جامەمان پێشکەش ئەکا کە خۆمان ژەهرمان تێکردووە.

***



مرۆڤ چاوی لە دونیاکەی ترە،
بـەڵام هەندێ ئیش لـەم دونیایە لێپرسینەوەی
لەگەڵ دەکرێ.

* * *

ڕاستگۆیی، ئـەوە نیە کە ببیتە خائین، چونکە
کەسێکی تر ویستویەتی،
ڕاستگۆیی ئەوەیە لەگەڵ خۆتدا ڕاست بیت.

* * *

گرنگ نیە هیواکان چرپەت بۆ بکەن،
ژیان بەلاتدا تێ ئەپەڕێت و ئەڕوات
و لە کۆتاییدا دڵسۆزت نابێ.

* * *



ڕاستگۆیی ئایا نهێنی پاراستنە؟ یان مانەوەیە بە بێدەنگی؟
تەنانەت ئەگەر قیامەتیش ڕوو بدات.

* * *

دڵسۆزی وەک خێر نادرێت، ئەوەی بیەوێ هەمووی ئەوێت.

* * *

ئەوەی سەگی کردووە بە سەگ دڵسۆزییە.

* * *



پێش ئەوەی دڵنیا بیتەوە جارێکی تر بیر بکەوە، چونکە هەموو شت بە دڵسۆزی دەست پێ ئەکات و بە خیانەت کۆتایی دێ.

* * *

دڵسۆزی یان ڕاکردنە بەرەو کەسێک، یان ڕاکردنە لەکەسێک.

* * *



دڵسۆزی گرتنی دڵی ئەو کەسەی خۆشت دەوێ لە ناو دەستت و گرتنی لە کفن، کاتێک لە دەستتدا ئەو دڵە بخەیتە ژێر خاکەوە.

* * *

لە ئاوێنەدا هەمیشە پێچەوانە ئەبینی، پێت وایە ڕاستەقینەیە، لێی دەدات، ئاوێنەکە دەشکێ، دەستت پڕ خوێن دەبێت.

* * *

هەرچەندە پەروەردەی بکەیت ناتوانی ئەو دڕندەیەی ناخت بێدەنگ بکەیت.

* * *

هەموو کەسێک ڕابردوویەکی هەیە،
هەندێکیش هەر لە ڕابردوودایە.

* * *



دەزانم لە ڕابردوو گیر بخۆیت چۆنە، بەڕاستی دەزانم لەوێ گەڕان بە دوای کەسێکدا مانای چیە.

* * *

تەنیایی بوون بریتی نیە لەوەی خۆت بە تەنها بی، تەنهایی تەنیایی بوونە لەگەڵ ئەو ئەهریمەنەی لە خەونتدایە.

* * *

کاتێک ئەو خەنجەرە گیر دەبێت لە دڵتدا، لە دڵتدا دەینێژیت کاتێک هەوڵی دەرهێنانی ئەدەی.

* * *



هەرچی باشە و خراپەیە کەسەکە خۆی دەیکات، تاوانەکەی خۆی دەگرێ و دەیکاتە سەر کەسێکی تر.

❊ ❊ ❊

ئەو بەڵێنانەی بەخۆمانی دەدەین بە خێراترین شێوە لەبیری ئەکەین.

❊ ❊ ❊

ژیانێکی هەڵە ناتوانێ بەڕاستی بژی.

❊ ❊ ❊



تا خەونەکە لە واقیع نزیکتر بێت، ئازارەکەی لەکاتی بەئاگا بوون زیاتر ئەبێت.
ئێستا پێویستە بوەستیت و بکشێیتەوە ئیتر.

* * *

تا توێکڵی پرتەقاڵەکە لێ نەکەیتەوە نازانی باشە یان خراپە.

* * *

کاتێک یەکێک واز لە خێزانەکەی ئەهێنێت، یاخود خێزانەکەی وازی لێ ئەهێنن، هەر لە تاریکیدا یەکتری بانگ ئەکەن.

* * *



خێزانت لە پشت نەبێ ئامانجێكی ئاسان ئەبیت بۆ دوژمنەكەت.

* * *

بێ دەسەڵاتی باوک
ترسناكترین نائومێدیە.

* * *

ئێمە ئیشی خۆمان ئەكەین و ئەڕۆین،
لە ڕەخنە بۆچی تووڕە بم،
هەموو كەسێک بە بیركردنەوەی
خۆی دەزانێ چی ئەوێت.

* * *



مەسەلە تەنها مردن نیە، مەسەلەی سەرەكی ئەوەیە بتوانی شوێنەوار جێبهێڵی.

* * *

من ئەو كەسەم خاوەنی هەموو شتێكم و هیچیشم نیە لەدەستی بدەم.

* * *



هاوڕێكان لەسەر هەمان سفرە نانیان خوارد، ئەوەی تێر بوو هەستایەوە و بوو بە دوژمنیان.

* * *

لەجێی ئەوەی کەسێک بە درۆ بەدەست بهێنم،
پێم باشترە کەسێک بەڕاستی لەدەست بدەم.

❊ ❊ ❊

لەگەڵ ئەو کەسە بە کە پێکەوە ئازارتان چەشتووە،
چونکە ئەوان بەهای دڵخۆشی ئەزانن.

❊ ❊ ❊

جاروبار پێویستە بچیتە سوچێکەوە و تەنها
سەیر بکەی،
تا بزانی تۆ بۆ ئەوان چەنێکی و
ئەوان بۆتۆ چەنێکن.

❊ ❊ ❊



من هیچ بۆ دڵخۆشبوون هەوڵ نادەم،
ئەگەر هات دڵخۆش ئەبم،
ئەگەر نەشهات سوپاسگوزار ئەبم.

* * *

گـەڕان بـە دوای چـارەی نائومێدی لـەوانـەیـە چارەکەی هەندێ جار ڕێک لەبەردەمت بوبێ، بەڵام کاتت نەبووە بۆ دۆزینەوەی.

* * *



چیتر درۆکـردن لـەگـەڵ هـەمـوو کەس
بەس نیە،
لـەدوای ئەوە کاتێک خۆشت بە
تەنهای ناتوانی ببیتەوە بەخۆت.

* * *

هەموو ئەو شتانەی هەیە لەوانەیە ڕۆژێک بێنە دی، بێ ئەوەی ئەو ئەگەرە لەناو ببەی ئەتوانی ئەو تاکە کەسەی خۆشت ئەوێ لەبیری بکەی؟

* * *

باشترین دزەکان لە کاتی چوونە ژوورەوە بۆ دزی ناگیرێن، بەڵکو لە کاتی هاتنە دەرەوەیـان ئەگیرێن.
باندەکان هەمیشە پلانێکی وا بەهێز دائەنێن کە چۆن بچنە ژوورەوە بۆ دزی کردن، بەڵام هاتنە دەرەوەیان لەبیر ئەچێتەوە.



* * *

ئەوانەی بۆ کوشتن ئەڕۆن ئەکرێ بە بێ کوشتن بگەڕێنەوە، بەڵام ئەوەی بۆ مردن ئـەڕوات ناتوانێ بێ ئەوەی بمرێ بگەڕێتەوە.

* * *

ئەوانەی بە کردارەکانیان بچووک بوونەوە، نابێ
وا هەست بکەن بە قسەکانیان گەورە ئەبن.

❋ ❋ ❋

هەرگیز بە دوای کەسێک نەگەڕاین ماچی بکەین،
نەشمان گوت لەپێناو ئێمە بمرە،
هەر تۆزێک خۆشی بویستینایە بەس بوو بۆ ئێمە.

❋ ❋ ❋

باوەڕ ئەکەم ئەوەی ئەیڵێن لە دڵەوە
ئەیڵێن،
بەڵام تا ئەمڕۆیە قسەکە، سبەی
لەوانەیە بەئەگەرێکی زۆر وانەبێت.

❋ ❋ ❋



یەکێک هەیە بەڵام بوونی نیە.

* * *

دادپەروەری خودا هەیە،
ماندووبوون و نیازپاکی مرۆڤێک بەفیڕۆ بدەی
خوا بەشێوەیەتی تر تۆ بەفیڕۆئەیات.

* * *

تۆ خۆت پارەی هەڵبژاردنەکانت ئەیەی
نەک ئەوانەی ئامۆژگاریت ئەکەن.

* * *



هەست بە ماندووبوونی ناخم ئەکەم.

* * *

ڕۆژێک دێت هەموو شتێک لەسەر ڕێگای خۆی ئەڕوات،
هیوادارم ئەوکات حەماسەت و ئارەزووی خۆمم مابێت.

* * *

گەر دابنیشتینایە قسەمان کردبایە، لەوانەیە هەموو شت چارەسەر هەبوایە، تەنانەت دانانی سەرت لە پێناو خۆشەویستیشدا.

* * *



من ئیتر پێم وانیە هیچ کەسێک شایەنی هەلی دووەم بێت.

* * *

یان عاشقی ئەبی، یان ڕقت لێی ئەبێ،
من لەگەڵ تۆ هەردووکیم بەسەرهات.

* * *

ئەوەی جێ ئەهێڵدرێ، زوو گەشە ئەکات، تەنانەت گەر هەموو خەمەکانیش لەسەر ئەو کەسە بێ کە جێهێڵدراوە، ئەوەی پەشیمان ئەبێت ئەوەیە کە ڕۆیشتووە.

* * *



کاتێک مێشکت هاتەوە سەرخۆت
بیر لە من مەکەوە.

* * *

درێژکردنەوەی ناوێت،
هەندێ شت هەرگیز نابێت.

* * *



هەر هیوایەک بە دەستمەوە بگرم لە دەستما
ئەمێنێتەوە.
هەر شتێکیشم خۆشبوێت،
ئەمرێت.

* * *

من بە هیچ شێوەیەک هـەوڵ بۆ دڵخۆشبوون نادەم، بەڵام ئەگەر هات خۆشحاڵ ئەبم،
ئەگەریش نەهات
تۆ خۆشبی برا.

* * *

ئێمە بۆ گۆڕینی دونیا هاتینە سەر ڕێگا،
بەڵام نەمانتوانی بیگۆڕین....
.ئێی..
وە دونیاش نەیتوانی ئێمە بگۆڕێت.

* * *

من لە ژیاندا باوەڕ بە دوو شت دەکەم، یەکەمیان؛ ئەوەی کە لەسەیرکردنی ئاوێنەدا دەیبینم. دووەم؛ ئەوەی کە لەسەیرکردنی ئاسماندا نایبینم.

* * *



ئـەگـەر دۆسـتـەکـەت لـەگـەڵـت بـێـت، یـاخـود لەبەرامبەرت بێت، ئەو ڕێگایەک دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لەتۆ بدات.

*  *  *

کاتێک کەسێک لە خێزانەکەت لەدەست ئەدەیت، ڕوخساریت لەبەرچاو لاناچێت، دەنگی بۆ هەمیشە لە گوێتدایە. وە بەردەوام لەگەڵت قسە دەکات.

*  *  *



ئەوە بزانە کە ئەو کەسەی هەمیشە سـەری لـەخـوارەوەیـە،چـاوی لەسەرەوەیە.

*  *  *

هەموو کەسێک بناسە، بەڵام باوەڕ بە هەمووان مەکە...
وە هاوڕێیەتی هەموو کەس مەکە...
! با شارەزاییت لە هەموو شوێنێک هەبێت، بەڵام بۆ هەموو جێیەک مەڕۆ...!!
لەبیرت بێت.

* * *

نەرم و نیانی
مانای بێ دەسەڵاتی ناگەیەنێت برا،
لەبیرت بێت...
کە هیچ شتێک هێندەی ئاو نەرم و نیان نیە،
بـەڵام کاتێک هێرشی تورەیی دەهێنێت بەردەکانیش ورد دەکات.

* * *



عاشق مەبە ئازیزەکەم،
شیرینی عەشق کەم کەس دەگات بە تامەکەی،
زۆربەی تاڵیەکەی ئەچێژن.

* * *

برازا
کۆمەڵگا هەرگیز دوو شتی بۆ لەبیر ناکرێت؛
مردنی کەسی دەوڵەمەند،
هەڵەی مرۆڤی هەژار.

* * *



برازا
پێکەنین باشترین دەرمانە،
بەڵام ئەگەر بەبێ هۆ پێبکەنیت
ئەوا پێویستت بە دەرمانە.





.بۆ ئەوەی نەچیتە ڕیزی مردوەکان و چاوەکانت بۆ بینینی حەقیقەت بێت، ئەوا گوێ بگرە بۆ ڕاستی و لە چەوتیەکان وەرە دەنگ.

* * *

.برازا
ئەو کەسانەی وەک خوێن بە ناخی دڵدا دەچن، نە بە دووریی نە بە مردن لەیاد ناچن.

* * *

.

برازا
ئافرەت تەنها یەک شتی لە پیاو دەوێت، ئەویش ئەوەیە کە بۆی بسەلمێنێت کە هەموو پیاوان وەک یەک نین....!

* * *

..



لێبوردن گەورەییت پێدەبەخشێت،
بەڵام...
تۆڵەکردنەوە خۆشیت پێ دەبەخشێت.

* * *

هـەنـدێـک جـار لـەبـەر ئـــەوەی نـاتـوانـیـن بە بەرامبەرەکەمان بڵێین: (من زۆر خەمبارم بۆ خۆم) دەڵێین: (من زۆر دڵخۆشم بۆ تۆ).

* * *



هەرکەسێک وا بیربکاتەوە کە شایەنی ئەوە نیە خۆشەویستی بکات، ئـەوا ئـەو کـەسـە تەنهایە، چارەنوسی ئەوانەی کە لە خۆشەویستی ئەترسن تەنها نین.
بەڵکو تەنها ئـەو کـەسـانـەن کە ڕقیان لە خۆشەویستی دەبێتەوە.

* * *

تەنهایی، ئەوە نیە کە بەتەنها خۆت بیت، بەڵکو تەنهایی، تەنهاییە لەگەڵ ئەو دڕندەیيەی کە لە کەمیندا چاوەڕێت دەکات.

❊ ❊ ❊

تۆ پێویستە لە هەندێک شەڕدا ئیتر بوەستیت و بکشێیتەوە کە ئەبینیت ناتوانیت تێیدا سەربکەویت.

❊ ❊ ❊

-تەمەنت چەندە؟

+لەپاڵ چ کەسێکدا؟

❊ ❊ ❊



((تۆ بۆ من، (هەرگیز جارێکی تر
لەو شتانەی ئەیڵێم لەسەروی هەموویانیت (نیت)).

* * *

ئەو هەستانەی کە ڕاستەقینەن هەرگیز لە دۆخێکی
نادیاردا بەجێت ناهێڵن.

* * *



من زۆرت بیرت ئەکەم،
بەڵام ئەوە نەتۆ بۆ من ئەهێنێ نە منیش
بۆتۆ.

* * *

کێشەیەکی هەیە لە هەر حاڵێکدا
باسی ناکات...
گەر باسی بکات ڕزگاری ئەبێت.

❋ ❋ ❋

وا دەزانیٚ تەمەنێکی زۆر درێژمان هەیە،
فێری چاوەڕێکردنمان ئەکات ژیان.

❋ ❋ ❋

ڕۆژە جوانەکان با بۆ ئەوان بێت،
من خراپەکانیش بیٚ لەگەڵ تۆ
ئەمەویٚ.

❋ ❋ ❋



ئیتر تەنها ئەتوانم بۆ شتە باشەکان بژیم.

* * *

هەندێک جار ئازارت دەدەن و دواتر وا ڕەفتار دەکەن کە تۆ بیت ئازارت دابن.

* * *

مرۆڤ ئەوەی خۆشی ئەوێ لەبیری ئەکات،
بەڵام ئەوەی خۆشی ناوێ هەرگیز.

* * *

سەلامەتی، ڕاستگۆیی، ڕێزگرتن،
گەر یەکێکیانت لەدەست دا
هەموویان لەدەست ئەیەی.

* * *



گەر کەسێک بەڕاستی تۆی خۆشبوێ، بۆ ئەوەی لات بمێنێتەوە ئیلا ڕێگایەک ئەدۆزێتەوە.
بیانووەکان بۆ ئەوانەن کە ئەیانەوێت کۆتایی بێت.

* * *

یاسایەکی ئاڵتونی؛
هەموو شتێک بزانە و وا ڕەفتار بکە هیچ نازانی.

* * *

ئـەیـخـوارد، ئـەیـخـواردەوە، ئـەخـەوت، هەڵەستا...
بەڵام
نەئەژیا.

* * *



ئێمە ئەوانەی ئەیزانین ئەیشارینەوە،
خەڵک ئەوەی نایزانێ باسی ئەکات.

* * *

ئەو کەسەی خۆی خۆی چارەسەر و باش ئەکات،
ترسناک و بەهێزە.

* * *

یـەکـەم شـت کـە نـابـیـنـایـەک کـاتـێـک
چـاوی دەکـرێـتـەوە دەیشکێنێت
گۆچانەکەیەتی.

* * *



ئەمەوێ بچمە دەرەوە و چەندین کاتژمێر بگەڕێم،
بەڵام مێشکم لەگەڵ خۆم نەهێنم.

* * *

کاتێک هەوا سارد ئەبێ، مرۆڤ ئەو درەختانە
لەبیر ئەکا کە سێبەریان بۆی ئەکرد.

* * *

مەرجەکان بگۆڕێن مرۆڤەکانیش ئەگۆڕێن.

* * *

ئەو دەستەم بگرە،
چیت بوێت چارەسەری ئەکەین.

* * *



گەر خۆشت ئەویم بیڵێ،
ئەمشەو پێویستە گوێم لێبێ.

❋ ❋ ❋

هەموو شتێک لەیەک کاتدا بێت بێ مانا ئەبێت.

❋ ❋ ❋

تەنها دەمەوێت ئەو شتە بەدەست بهێنم کە تۆ بەفیڕۆی دەدەیت تەنها جارێک.

❋ ❋ ❋

خۆشویستنێکی باش بەس نییە
بۆ هیچ شتێک، کەسێک کە خۆشم
دەویست فێری کردم.

❋ ❋ ❋



ئـازار، هـەمـووکـات لـەلای کـەسـە بـەوەفـاکـەوە دەرئەچێ.

* * *

هـەمـوو خۆشەویستییەک نـاتـەواوە، تەنانەت خۆشەویستی تەواویش.

* * *

بۆ ئـەوەی بیرنـەکـەمـەوە خـەوتـم، بـەڵام هەموویم لە خەونما بینی.

* * *



نـاتوانی هەمووان ببەیتە سبەینێ،
هەندێک پێویستە لە دوێنێیا بمێننەوە.

* * *

کێ کێ لەدەست ئەدات ڕۆژگار دەری ئەخات.
......
ڕۆژگار فێری ڕاهاتنمان ئەکات نەک لەبیر کردن.

* * *

گوڵ لەسەر بەرد ناڕوێ،
ئاو لە خۆڕایی سەرف مەکەن.

* * *



ئینسانێک ٤٠ ساڵ بەردێک لەسەر پشتی هەڵبگرێت،
یەک ڕۆژ بەردەکە دابنێ
خەڵک نالێ چل ساڵ هەڵیگرت
ئەڵێ ڕۆژێک داینا
ئینسان بەو شێوەیەیە، ئیشە باشەکانت بێ منەت ئەکات.

* * *

کەس لە پێناو ئێمە چاوەڕێ نەکات،
ئێمە ئەو قاوەیەمان بە تەنها خواردەوە.

* * *



ئێمە نەبووینە خۆشەویستترینی هیچ کەسێک.

* * *

نەمزانی ئەو جووتە چاوەت وام لێ ئەکا پێبکەنم
تا ئەوکاتەی تۆم ناسی.

* * *

تۆ ئەزانی تۆ
لەو دڵە سادەتا ئەمرۆخێنی.

* * *

مرۆڤەکان ناگۆڕێن،
درک بەوە دەکات کە چیتر وەک
جاران نییە.

* * *



ئەوەی مرۆڤ ئەکوژێ ئومێدە.

* * *

هاوڕێیەکی ڕاستگۆ.
لەجێی دەهەزار خزم و ناسیاوە.

* * *

تۆ پێت وابوو ئێمە وەک ئەوانی ترین.

* * *

چـەنـدیـن کـاتـژمـێـر سـەیـری
بۆشاییەکت ئەکرد،
چۆن ئەم دەردەیان تێ ئەگەیەنی.

* * *



با بڵێین تۆ زەرەرت بۆ هیچ کەسێک نیە،
بەڵام لە ڕاستیدا تۆ خۆت بەفیڕۆچووی.

* * *

لەکێ و چاوەڕێی چیم لێ ئەکردن....
بیرم ئەکەویتەوە پێئەکەنم بەڕاستی.

* * *

دونیای کەسە باشەکان نیە،
دونیای یاریکەرە باشەکانە.

* * *

ئەو کەسانەی ئێمە بەزەییمان
پێدا دێتەوە زۆر دڵخۆشن لەگەڵ
کەسانی تر.

* * *



هەندێ حەق هەیە ئازاد ناکرێ،
چونکە هەندێک مرۆڤ شایەن بەوە نین.

* * *

گەر تۆش نەچیتە لای ئەو، ئەو دێ تۆ ئەدۆزێتەوە
نسیب بەم شێوەیەیە.

* * *

ئەمجارە مەیە،
زۆر درەنگ بووە.

* * *

زەردەخەنە بکە، سبەی لە دوێنێ
باشتر دەبێت.

* * *



ئیتر لە ژیانما تاکە کەسێکیشم ناوێ کە ماندووم بکات.

* * *

ئێمە بووینە هاوڕێی کەوتووەکان،
کەچی کەوتو ئینکاری لە کەوتنی ئەکات.

* * *

ئەڵێی جوانترین زەردەخەنەیان داوە بە ئەو لە دونیادا.

* * *

لەسەر مێزێکی، لەڕاستیدا ئەوەندە دووری کە ناویشت ناگات پێی، بەڵام لەهەمان کاتدا وا هەست ئەکەی لە کورسییەکەی تەنیشتت دانیشتووە.

* * *



ئازارم مەدە، لەو شوێنەی ئازارت داوم هەر ئەویٚ ئازار ئەیەیتەوە.

* * *

مرۆڤەکان ئەڕۆن کە زۆرت خۆشویستن.

* * *

دڵنیاتان ئەکەمەوە
دڵم زۆر شکاوە.

* * *



هیچ کـەس هیچ کـەس لـەدەسـت نـادات،ئـەوەی ئەڕوات کەسی تر ئەدۆزێتەوە، ئەوەی ئەمێنێتەوە خۆی ئەدۆزێتەوە.

❋ ❋ ❋

من کەسێک نیم لـەو شوێنەی کە وازت لێهێنا بیدۆزیتەوە.

❋ ❋ ❋

لەبیر کردن جوانترین دیارییە بە مرۆڤ درابێ.

❋ ❋ ❋



شتە جوانەکان هەمیشە درەنگ دەبنە ڕاستی، پەلە مەکەن.

❊ ❊ ❊

هەموو شتێک چاوەڕێی ساتەوەختی خۆی دەکات.

❊ ❊ ❊

توانای هەڵگرتنی بارێک بەو مانایە نییە کە کێشی نەبێت.

❊ ❊ ❊

سەرەڕای هەموو شتە ناشرینەکانی دونیا، بینینی تۆ زۆر جوانە.

❊ ❊ ❊



گوڵێک کەئاوی نەدەی نابێ گلەیی وشکبوونی لی بکەی.

* * *

ئـەزانـم تـۆ ڕاسـت نـاکـەی، بـەڵام حـەزم بە درێژکردنەوەی بابەتەکە نیە.

* * *

(ئەو کەسەی خۆشم ئەویست ئەم نەبوو)
لە داهاتوو ئەوە ئەڵێی.

* * *

لە خەوی هەستاندم و گریاندمی
ئەو ئازارە.

* * *



.تەمەنم ببێتە هەرچەن بابێ، من هەمیشە
پێویستم بە دایکمە.

* * *

.
تۆ دڵت وەک ڕوخسارت نەبوو.

* * *

.
ئەگەر یەکێکت خۆشویست و
لەبەرامبەر ئەوانی تر کوێر نەبووی
خۆشت نەوێت.

* * *

گەر هیچ شتێکیش نەبێت بەیانی
هەردێت.

* * *



وازی لێبێنە،
ئیتر گەر بیریشی بکەم هیچ نالیم.

* * *

من چیتر لە ژیانی قسەکردندا نیم،
لە وەرزی جێبەجێکردنیانم.

* * *

ژیان بەبێ پارە کۆتایی نایەت، خەمت نەبێت.

* * *

خەڵک چی ئەڵێ با بیڵێ،
تۆڵە جوانترین شتە.

* * *



من کاتێ لەناو تاریکی بووم، تۆ بوویتە ڕووناکی بۆم، بەڵام ئێستا ئەمەوێ فێری تاریکی بم.

* * *

فێرم بکە
بیرکردنەوە چۆن لەبیر ئەکرێت؟

* * *

گەر پرسیاریان لێ کردی بڵێ وازی لەهەموو شت هێنا.

* * *

چی ئەبێ با ببێ، دوای زستان هەر بەهار دێ.

* * *



تۆ بی ئەوەی قسەی خۆت تام بکەی قسە بکەی،
ئەبێ لە وەڵامەکەش ئازار نەچێژی.

❊ ❊ ❊

هەموو شتێک بە هەڵە لێکدەدەیتەوە،
تەنانەت بێدەنگیش.

❊ ❊ ❊

کەس لە ژیانت بەزۆر مەهێڵەوە،
گەر بیەوێ خۆی جێگای خۆی ئەگرێت.

❊ ❊ ❊

ناتوانی لۆمەی کەسێک بکەی کە
بە دەستی خۆت دەرت کردووە.

❊ ❊ ❊



پێم وابوو پێگەیشتووم و ئارام بوومەتەوە، دەرکەوت ئیهمالم کردووە.

* * *

ئـەوەی کە تۆیـان لـە دوورەوە خۆش ئەوێت جوانترینە لە خۆشەویستیدا.

* * *

لەگەڵ ئێوەدا قسە سودی نیە، ئەبێ وەک خۆتان ڕەفتارتان لەگەڵ بکرێ.

* * *



هەر برینێک و ئازارێک شتێکی تازە فێری ئینسان ئەکات،
شتێک ئینسان فێری وەستان بکات لەسەر پێ ئەبێ چ لەدەستدانێکی گەورە بێت.

* * *

گەر لە جامێکی شکاوەوە سەیری کەسەکان و شتەکان بکەی وائەزانی هەموویان شکاون.

* * *

گەورەترین ئازار ئەو ئازارەیە کە غیرەتی ئەوەت نەبێ لەگەڵ کەسانی دیکە باسی بکەیت.

* * *



جەهەنم خاڵییە، هەموو شەیتانەکان لێرەن.

* * *

نە لە ڕێگاکانی ناخمدا جێگام بویەوە، نە لە دونیای دەرەوە.

* * *

هەمووان ڕۆیشتن، بەس من مامەوە، ئێستا هەمووان دێن، تەنها من ناتوانم بوەستم.

* * *



گەر نەتتوانی شتەکان بگۆڕیت و نرخی تۆشیان نەزانی،
تۆش بۆ ئەوان چیتر خۆت پارچە پارچە مەکە.

* * *

بەو شێوەیەی ئازارم نەبێت لە ڕەفتارکردن بێزاربووم.

* * *

ئەکرێ یەک ڕستە هاوسەنگی مرۆڤێک تێک بدات.

* * *



تا دواخالّی گرنگی پێدان گرنگی پێدەدەم، بەڵام لەدوای ئەوەوە چیتر گرنگی پێنادەم.

* * *

ئەی پێکەنینەکەت چی؟ ئەوەیان چۆن لەبیر بکەم!

* * *

ئەو شتانەی لە ناخمدا هەڵم گرت،
ڕۆحمیان پوکاندەوە.

* * *

بە دوور هەژمارت ناکەم،
لـە هـەمـوو گـۆرانـیـەک هـەیت
کەگوێی لێ ئەگرم.

* * *



وا مەکە با نەسوتێین، کاتەکە تەواو بووە، ئەگەر بڕیارە بسوتێیت با کاتەکە بسوتێنین.

* * *

خەیاڵم هەیە، بەڵام توانای چاوەڕوانیم نیە.

* * *

ئەوەی چاوم بینی دڵم باوەڕی پێ نەکرد.

* * *

ئەمشەو زۆرم پێویستە کە گوێم لێت بێت،ئەمە لە هەر شەوێکدا ئەتوانی بیخوێنیتەوە.

* * *



ڕۆژێک دێت هەرکەسێک لە دواکەوتنی کەسێک
یان زوو جێهێشتنی کەسێک پەشیمان ئەبێتەوە.

* * *

ئێمە ئەزانین کە تۆ زیادەڕۆیی ئەکەیت،
پێویست بە نمایش ناکات.

* * *

بیستوومە تۆ بڕیارت داوە جێمان
بهێڵی،
مەیکە

* * *



نیازت وایە کەسێکی ترت خۆشبوێت و ببیتە هاوڕێی کەسێکی تر، ئەوەش مەکە.

* * *

هەر مرۆڤێک بەقەدەر ئەو دڵەیە کە هەڵی گرتووە، دڵی بشکێنی خۆشی دەشکێ.

* * *

بۆ ئەوە نیە مێشکم ئارام بێتەوە، تەنها ئەمەوێ بێ دەنگ بم.

* * *



قسەکردن لەسەر ئازارێک کە نەمان چەشتووە، هەمیشە شتێکی ئاسان بووە.

❊ ❊ ❊

ئیتر ماندوو بووم لەوەی وا نیشانی بدەم کە چاوەڕێی هیچ ناکەم، لەکاتێکدا دونیایەک هیوام هەڵگرتووە.

❊ ❊ ❊

هەتا مرۆڤەکان کەمتر بن، زەرەرەکانیش کەمترن.

❊ ❊ ❊



هەندێ هاوڕێیەتی لەدوای مردن دەست پێ ئەکات، هەندێک حەسرەتیش تەنها بە مردن کۆتایی دێت.

* * *

ئەکرێ مرۆڤ لە شەوێکدا واز لە هەموو شت بێنێ.

* * *

ئەوەندە خۆشت ئەوێ کاتێک وازی لێ ئەهێنی شەرم لە خۆت ئەکەیت،

* * *



گورگ گەر بشزانێ کە ئەمرێت هەرگیز دەست بۆ سەگ ناکاتەوە.

* * *

ئەم ژیانە گەنج بوونێکم و دڵخۆشبوونێکم قەرزارە.

* * *

من سەرم بۆ کەس دانەنا،

بەڵام بۆتۆ کەوتم.

* * *



کاتێک لە ڕۆژەکانا ئەژین،
دوێنێکانیش لەبیر ناکرێن.

* * *

ئیتر چی ڕوو ئەدات با ڕوو بدات،
چونکە نەمتوانی چارەسەری بکەم.

* * *

مرۆڤەکان دەتوانن بە دەنگی خۆیان لە
باوەشت بگرن ئەگەر بیانەوێت.

* * *



هەر شتێک ئیهمالی بکەیت ئەمرێت.

*** 

تەنانەت کاتی ڕووخانی ئێمەش هێشتا لە ئێوە بەرزترین.

***

هەڵگرتنی ئـەوەی لـە دڵـتدا نییە، گـەورەتـرین بارگرانییە لە دونیادا.

***

بێدەنگم، بەڵام کوێر نیم،
بێ خەم بن.

***



ئیتر هیچ ڕێکەوتێکیش کۆمان ناکاتەوە.

* * *

من ئەو شتانەی لێیان ئەترسام لەدەستیان بدەم ئازادم کردن.

* * *

چیتر باوەڕکردن یان نەکردن هیچ شتێک ناگۆڕێ.

* * *



دلێک ئەتوانی چەند جار بشکێنرێ؟

****

لە ڕووناکیدا هەمووی ڕائەکات لەگەڵت، بەڵام لە تاریکیدا بەتەنها هەڵدێم.

****

شتانێکی زۆر هەیە تێت بگەیەنم،
بەڵام شتێک کە بگۆڕێت نیە.

****

هەندێ جار ڕوودەدات،
ئەوانەی تۆ ناتوانی ئازاریان بدەی
ئەوان خۆشەویستترین کەسەکانت
ئازار ئەدەن.

****



فیشەکەکە لە کوێوە لێی داوم هێشتا نازانم، بەڵام هەرگیز لەتۆم چاوەڕێ نەئەکرد.

* * *

ڕۆژێک دێت تۆ لەمن تێ بگەیت.

* * *

ئەمە جیابوونەوە نەبوو، ڕاکردنی تۆ بوو لە من.

* * *

ئـەوانـەی نـوسـیبووم هـەموویم سڕییەوە، بەڵام ئەوانەی سڕیمەوە هەرگیز جارێکی تر نەمنوسییەوە.

* * *



هەڵبەتە ڕۆژێک گوڵەکانی ئێمەش ئەکرێنەوە.

❊ ❊ ❊

هەموو کەسێک بە کەموکوڕییەکانییەوە بەدوای کامڵبووندا دەگەڕێت.

❊ ❊ ❊

ژیانێک وێران بوو لە ڕێگای تۆدا.

❊ ❊ ❊

خەیاڵەکانیش جوان ئەبوون ئەگەر بمانتوانیایە بژین.

❊ ❊ ❊



هەر کاتێک لە شتێکدا کە گومانت لێ دەکری، لەو گومانە بەشێکی ڕاستی تیایە.

* * *

با سبەینێیەکی باشمان هەبێت، تا بتوانین دوێنێ لەبیر بکەین.

* * *

ئەخلاق بە پارە نیە، بۆیە لای زۆربەی مرۆڤەکان قیمەتی نیە.

* * *

ئەو کەسەی کە وازی لە خۆشەویستی هێناوە، هیچ شتێکی تر نایترسێنێ.

* * *



لەناو مێشکمدا هیچ جێگایەک بوونی نەماوە بۆ قسەکانت.

* * *

منت خستە سەر ڕێگا و خۆشت بۆ شوێنێکی دیکە ڕۆیشتی.

* * *

کاتێک ئـەوەی ئـەوان دەیانـەوێت بەدەستی ناهێنیت، ئەبی بە کەسێکی نەویستراو لایان.

* * *

بە ڕێکەوت یەکتر دەبینین، کەچی ئەو دەبێتە هەموو داهاتوو.

* * *



گەر یەکتربینین بکەویتە کۆتاییشەوە،ئەوانەی یەکیان خۆشەوێ دیسان یەکیان خۆش ئەویتەوە.

❊ ❊ ❊

ئەو ڕوخسارەی کە زۆر زەردەخەنەمان بۆ کرد دەبوو تفی تێ بکرێ، ئەبوو بەو شێوەیە بێت.

❊ ❊ ❊

ناتوانم ماڵئاواییت لێ بکەم، بەڵام ناشتوانم بتبینمەوە.

❊ ❊ ❊



ئەو شەوانەی لە تاو دەنگە دەنگ خەوم لێ نەدەکەوت لەدەرەوە هیچ دەنگێک نەبوو.

❊ ❊ ❊

من شەرم لەگەڵ تۆ تەواو بوو، ئیتر تۆش بەقەدەر ئەو شتانەی وازم لێ هێنا ئازادی.

*** 

من دەربارەی تۆ خەمێکی گەورەم هەیە، بتبینم لە خۆشەویستیتا ئەمرم، نەتبینم لە حەسرەتا.

*** 

زەمان تێ ئەپەڕێ، سەیر ئەکەی لەهەمان شوێنی، بەڵام هەمان کەس نیت.

*** 



گەر ئەوەندە بیرت بکەم بمرم، یەک هەنگاوی تر نانێم بۆلات.
ئەگەر جارێکی تر لەباوەشت بکەمەوە، ئەوە ناتوانم چاک ببمەوە.

*** 

کاتێک ئەخەوم چاوەکانم لەگەڵ دەرد و کێشە لێک ئەنێم، کاتێک هەڵدەستم چاوەکانم بە دەردەوە دەکرێنەوە، باوەڕ بکە بە قەدەر قروشێک حەسرەتم نەماوە.

* * *

هەمووان چاوەڕێی تێگەیشتنن، بۆ لای ڕاست ئەڕۆی چاوەڕێتن، بۆلای چەپ ئەڕۆی چاوەڕێتن، کەس ناپرسێ تۆ چیت ئەوێت، ئایا پێویستە ئێمەش لە تۆ تێبگەین؟ هەمووی چاوەڕێی تێگەشتنن لە ڕووداوەکان، نەک تۆ.



* * *

لەو دونیایە ئەژین کە خیانەتکار چاوەڕێی دڵسۆزیە.

* * *

کاتێک هەمووان بە هەڵە لە تۆ تێ ئەگەن، کەسێک بڵێ با وابێ من ئەزانم چی لەناو دڵتە،زۆر شتێکی جوان دەبوو.

❊ ❊ ❊

ئێمە لەو مرۆڤانە نین کە ڕابکەین بۆ ئەو هەنگاوانەی کە هەڵناگیرێن و مەحاڵن.

❊ ❊ ❊

خۆشەویستی یەک شتە، بەڵام ڕێز هەموو شتێکە.

❊ ❊ ❊

ئەگەر تۆ تێگەشتبایت و ئیحراج بووبای دەمێک بوو کۆتایت هاتبوو.

❊ ❊ ❊



گەر ویستتان كەسێك لەدەست بدەن زۆرتان خۆشبوێت.

* * *

كە دەبێتە شەو هەموو خەمەكان دەبن بە دوو ئەوەندە.

* * *

ئاهی ئازارەكان بۆ هەر شوێنێك بچێت خاوەنەكەی دەدۆزێتەوە.

* * *

لـەوانـەیـە لـە ڕووی جـەسـتـەییـەوە زەردەخەنە بكەین، بەڵام با ڕاستیەكە بڵێین؛

لـە ڕووی ڕۆحـیـیـەوە زۆر ماندووین.

* * *



ئایا ئەوەی ئەڕوات لەگەڵ ئەوانەی دێن بگەڕێتەوە وەک یەکن؟ نەخێر.

* * *

من وەک خۆم بناسە، لەگەڵ هەموو کەسێک وەک یەک نیم.

* * *

ئـەمـەویَ زۆر شتت تێبگەیەنم، بـەڵام بەبیَ قسەکردن.

* * *

هەموو شتەکان ئەگۆڕێن، بەڵام شوێنی تۆ هەر لەجێی خۆیەتی.

* * *



چارەسەرمان نەکرد، نەشمان توانی وەلای بنێین، چونکە تۆ تەنها قسەدەکەیت.

* * *

چاو ئەوەی دەیبینێت بەدڵی نییە، ئەوەی خۆشی دەوێت دەیبینێت.

* * *

نامەوێ بیر بکەمەوە، ماندووبووم لە بیر کردنەوە، تەنها ئەمەوێ بخەوم.

* * *

شوێنگرەوەی ئـەوەی کەسێکت زۆر خۆشبوێت ئەوەیە کە چیتر کەسی دیکەت خۆش نەوێت.

* * *



زۆر گرنگیدان وا لە کەر دەکات باوەڕی بەوە هەبێت کە شێرە.

* * *

چاوەڕوانییەکان دڵتەزێنە، چاوەڕێ مەکەن.

* * *

ئەگەر قورس بوو خۆشت دەوێ، بەڵام ئەگەر خۆشی نەوێیت ئەوکات قورس دەبێ لەسەرت.

* * *

ئەگەر دەست لە شانم بدەن ئەوە دەڕوخێم،
لە لێواری هەموو شتێکدا دەژیم.

* * *



.کاتێک بە جوانی گوڵمان دەکرد، لە زەوییەکی هەڵەدا نێژراین.

*** 

.

دڵ لەسەر ئەو لقە دەشکێت کە زۆرترین جار لەسەریەتی.

***

.

کەوتنە خوارەوە شتێک نیە لە بینایەکەوە بکەوێتە خوارەوە، من بینیم کەسێک بە ڕستەیەک کەوتە خوارەوە.

***



لـەوانـەیـە ڕۆژە خـراپـەکـان لـەبیر بکەین،بەڵام ئەوە لەبیر ناکەین کێ دەستی بۆ درێژنەکردین.

***

.

ئاگر سێبەری نیە، جا لەبەر ئەوەیە ئاگری ناخی ئێمە ئەوانەی لەدەرەوە سەیر ئەکەن نایبینن.

* * *

ئێستا تۆ بەخۆت دەڵێی من هیچ ستەمێکم لێ نەکرد.

* * *

ڕۆژێک دێت لە خەیاڵەکانمان جوانتر دێتە دی.

* * *

تا زیاتر گرنگی پێ بدەیت، دەبێت زیاتر لەدەستی بدەیت.

* * *



کاتێک ویستی بڕوات، سەیری بکردایە نەدەڕۆیشت.

* * *

مرۆڤە بێ هێزەکان تۆڵە ئەکەنەوە، مرۆڤە بەهێزەکان لێیان خۆش ئەبن، مرۆڤە زیرەکەکان گرنگی پێ نادەن.

* * *

لەوانەیە خۆشەویستی لە شوێنێکی نادیارەوە دەربکەوێت، بەڵام لەخۆیەوە نامرێت.

* * *

هیچ کەسێک ناڵێت من شکاندومە، هەمووی دەڵێت شکێنراوم.

* * *



لە پێشتریش جەهالەت و نەزانی هەبوو، بەڵام وەک ئێستا ئەوەندە خاوەنی متمانەبەخۆ بوو نەبوو.

* * *

فێربووم لە کاتی هاوارکردندا بێدەنگ بوون چییە.

* * *

سەرەتا بەهۆی نیەت باشیمەوە لەدەستم دا، ئێستاش نیەت باشیم لەدەست دا.

* * *

گەر لە تەنهایی بترسامایە لەگەڵ هەمووتان بەباشی ڕەفتارم ئەکرد.

* * *



بەقەدەر هەموو دونیا لێی تورەی، بەڵام بە حاڵ زەرەرێکی پێ بگات ئەوەی سەرەتا ڕائەکات بۆلای تۆیت.

❊ ❊ ❊

ئەم چیرۆکە نیوە نەبوو،
خۆی چیرۆکەکە ئەوەندە بوو.

❊ ❊ ❊

ناتوانی هیچ کەسێک کۆنترۆڵ بکەی،
وەفا و دڵسۆزی لە ناخەوە دێن.

❊ ❊ ❊



تەنها بەوەی ناو ئاوێنە باوەڕ ئەکەم.

* * *

تۆ بەو شێوە نەبووی، یەکێک چووە مێشکتەوە و تۆی گۆڕی.

* * *

خەڵکی زۆر بناسە، کەمێکیانت خۆشبوێ و بە هیچیان بڕوا مەکە.

* * *

هیچ سوودێکی نییە ڕاست بیت کاتێک تۆ ئەو کەسەی کە دڵتەنگ بوویت.

* * *



هەندێ لە پێکەوە بوونەکان دەکەونە قیامەت.

* * *

نەتوانی سنگت شەق بکەیت بۆیان، مرۆڤەکان تێناگەن لەوە.

* * *

گەر ژیان لەگەڵم ڕاست بووایە داوای لێبوردنی لێ ئەکردم.

* * *

مرۆڤ دەبێ ببێتە ماڵ بۆ مرۆڤی دیکە، نەک لەگەڵی بچێتە دەرەوە و کۆڵانەکان.

* * *



.

نامخاتە پێکەنین، نامخاتە گریان، هیچ کەسێک وەک تۆ.

❊ ❊ ❊

.

دووبارەی نیە ئەو ژیانەی کە ئەتوانی بژیت.

❊ ❊ ❊

.

هەڵەم زۆر بوو، جوانترنیان تۆ بووی.

❊ ❊ ❊

هەموو کاتێک بەو شێوەیەم کە وەک ئەوەی کەمێکی تر تۆ ئەڕۆی.

❊ ❊ ❊

.



ئەو کەسەی کە لە پێناوت کێشە دروست ناکات، تەنها چاوەڕێی ڕۆیشتنت ئەکات.

* * *

جارێکی تر پەیوەندییت پێوە ناکەم، بەڵام تۆ بیکەی وەڵامت ئەدەمەوە.

* * *

تۆ تەنانەت ڕێگات نەدا باشیش بیر بکەمەوە.

* * *

گەر مرۆڤەکان ڕاست بوونایە ئەوکات هەڵە دروست نەئەکرا.

* * *



بیرە باشەکان زوو لەبیر ئەکرێن،
تۆ بیرە خراپەکانمی.

* * *

هەر شتێک بەبێ خۆشەویستی بمێنێتەوە ئەمرێت.

* * *

پێم وایە نرخێکی زۆر ئەدەم بۆ ئەوەی تۆم
خۆشبوێت.

* * *

چی ئەبێت ئەوکاتەی ئەگەیتە
جیاوازییەکان و دەزانی جیاواز
نەبووم.

* * *



.

ماوەیەکی زۆرە ئەو گۆرانییە کۆتایی نەهاتووە.

* * *

.

من حـەزم لە تۆڵەکردنەوە نییە، بەڵام داب و نەریتە کاتێک تۆڵە بکەمەوە.

* * *

.

دڕکـەکـان مـاچ دەکـەیـن و گـوڵـەکان سـەریان سورڕدەمێنێت.

* * *

.

ڕێک ئەبینەوە ان شاءالله با ئەو کێشانە کۆتاییان بێت.

* * *



بێ کەس نیم، بەڵام پێویستم بە کەس نیە.

*** 

ڕێگای جیابوونەوەمان زۆر تەسکە، ئەبێ لە تەنیشتی یەکەوە بڕۆین.

*** 

من ئەستێرەناس نیم، بەڵام هەرگیز هەڵە نەبووم کە پێشبینی کێم کردووە.

*** 

دوای ئەو هەموو سەبرە، من پلانی قیامەت دادەنێم کاتێک ئەوەی دەمەوێت بەدەستی ناهێنم.

*** 



منیش نەمدەویست بەو شێوەیە بێت، بەڵام بوو، ئێستا هەرکەسێک تامی ئەو ژیانە ئەکات کە بۆی دانراوە.

* * *

ئێستا پیر بوویت، ناتوانیت برینێک دروست بکەیت، ئەگەر دەستیشی لێبدەیت.

* * *

لەم دونیایەدا کە تەنانەت فێڵبازەکانیش چانسیان پێدەدرێت، بۆچی بە عاشقەکان نادرێت؟

* * *



ئەگەر بیویستایە بە هەر شێوەیەک بێت ڕێگای خۆی دەدۆزییەوە، تۆ وازی لێبێنە بڕوات، کەس لە نەبوونی کەس نامرێت.

* * *

ئەو خانووە هەزار جار سوتا، منیش هەزار جار چاکم کردەوە.

ئێستا دووبارە وا دەسوتێت، بەڵام تەنها دڵۆپە ئاوێکیشی پێدا ناکەم.

* * *

دانیشتم چەندین کاتژمێر تا بزانم چی باشە بۆمن، بیرم کردەوە، ڕوخسارت بۆ چرکەیەک لەبەرچاوم لانەچوو.

* * *



لەبیرکردنی کەسێک بە مەجبووری، پێم وایە گەورەترین ئازارە.

* * *

وەک ئەوەم کە لەبیرت بکەم، ڕێگا بەوە مەیە.

* * *

تۆ گەورەترین لاوازی من بووی، نەمتوانی لێی ببەمەوە.

* * *

ئیتر ناخەوم، بەڵام بابەتەکە چیتر پەیوەندی بە تۆوە نیە.

* * *



نە سـەروەت و سامانە و نە ڕوخسار، ئەوەی مرۆڤ ئەکا بە مرۆڤ بەزەییە.

❋ ❋ ❋

گـەر بیری کەسێک بکـەی کە مـردووە، بۆت دەرئەکەوێ ژیان چەند بێ مانایە.

❋ ❋ ❋

دەمویست لە هەموو کەسێکەوە زۆر نزیک بم، سەیرکردنی ئینسانەکان لە دوورەوە زۆر قورسە.

❋ ❋ ❋

گـەر بتـەوێ لـە هـەمـوو ئـەوانـە تێبگەین کە مرۆڤەکان ئەیڵێن زۆر ماندوو ئەبیت.

❋ ❋ ❋



لە ژیانماندا شتی جوان ڕوودەدەن، بۆ نمونە ڕوونەدانی شتە خراپەکان.

❋ ❋ ❋

مەیە ناو مێشکەوە، وەرە لامەوە.

❋ ❋ ❋

ئەگەر هەڵە بووم ڕاستم مەکەرەوە، ئەم جۆرە دەستتێوەردانانە بێزارم دەکەن.

❋ ❋ ❋

ئـــەوەی مـن کـردم ڕاسـت بـوو، ئـەوەی لەدەستمدا کەسانی هەڵە بوون، هیچ بە خەیاڵما نایەت.

❋ ❋ ❋



گەر بتانەوێ لەسەر هەمان ڕێگا بن، بەهەر شێوەیەک بێ دەگەنە یەک، لەوانەیە یەکێکیان بەڕاکردن، یەکێکیشیان چاوەڕێ بکات، بەڵام هەر دەگەنە یەک.

* * *

ئەوان پێیان وایە خۆشەویستی ئەوەیە لە تەنیشت یەکدا بن.

* * *

ئەو شتانەی زۆرترین نەفرەتم لێ ئەکردن زۆرترین جار لەو کەسانە بینیم کە خۆشم ئەویستن.

* * *



ئایا هۆکارەکەی ئاو نیە، دڵۆپە دڵۆپە کۆبوونەوە و بوونە هۆی خنکان؟

* * *

ئەم ژیانە هی منە، بەڵام نیوەی ژیانم بۆ ئەوانی تر ژیام.

* * *

هەموو خیانەتێ بە خۆشەویستییەک دەست پێ دەکات.

* * *

درۆی ناوێ، ماڵئاوایمان لە هەندێ لە ئومێدەکانمان کرد.

* * *



ئەو گورانیەی لەسەر بێت دەمەوێ ڕێگای ماڵەوە تۆزێک دوورتر ببێتەوە.

* * *

ئافرەتەکان پرسیارێک ناکەن وەڵامەکەی نەزانن.

* * *

کاتێک فێربووی نرخی ئەو شتانەت زانی کە پێتم بەخشی، وەرەوە با دووبارە یەک بناسین.

* * *

با کەسی ترمان خۆش نەوێت ئیتر، بەڵام ناشتوانین پێکەوە بین.

* * *



ئەوەی بەڕاستی تۆی خۆش ئەوێ، هۆکارێک ئەدۆزێتەوە و دێتە لات.

* * *

ئەوانەی گرنگیان پێ ئەدەم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کەمتر ئەبێتەوە.

* * *

ئێمەش خۆمان لەسەر ئەوە ڕائەهێنین ماڵئاوایی لە یەکێک بکەین کە هەرگیز نەهاتووە.

* * *

ڕاکردن بەرەو ئاگر لەتۆوە فێربووم.

* * *



ئەوەی کە هەبوو ئەوەشی نەبوو لەناوچوو لە ناخمدا، ئێستا تەواو بەتاڵم.

*** 

کەسێک لە ژیانتدا مەهێڵەرەوە کە درۆت لەگەڵ بکات و بێڕێزیت پێبکات و نیازپاکیت خراپ بەکاربهێنێت و وزەت بڕژێنێت.

*** 

گەر خۆشت بوێت لەپێناوی دەژیت و قسە ئەکەیت لەگەڵی،
غرور کەسی دڵخۆش نەکردوە.

*** 



ئەتوانی گۆرانیەکە بکەیتەوە، چیتر بیرەوەریم نەماوە.

* * *

تۆ سـەرسـام بـووی بـەو ئۆقیانووسانەی کە دەتزانی دەتخنکێنێ.

* * *

هەتا ئەتوانی ڕقت لێم بێت، ئیتر شتێکی وەک خۆشەویستی لە نیەتما نیە.

* * *

لە دووەم ڕۆژی دونیایەکی سێ ڕۆژیدام، نە چێژم لە یەکەم ڕۆژی بینی، نە ترسم لە سێیەم ڕۆژی هەیە.

* * *



هەڵەم زۆر بوو، جوانترینیان تۆبوی.

❊ ❊ ❊

من کەسێکم کە هێشتا لە هەندێ هەڵەی کە کردوومە پەشیمان نیم.

❊ ❊ ❊

ئەو تەنها نامەیەک ئەنێرێ،
تۆ بیست جار ئەیخوێنیتەوە.

❊ ❊ ❊

پێویستمان بە نامەیەک هەیە بۆ ئەوەی هەست بە باشی بکەین.

❊ ❊ ❊



هەندێک کەس هاوڕێی یەکتر نین، زۆر بە بەختن.

❊ ❊ ❊

گەر لۆمەم ناکەن پێتان ئەڵێم کەمێک بۆخۆتان بژین.

❊ ❊ ❊

هەموو کەس لەکاتی لەدەستدانی کەسێک ئەسوتێن، من کاتێ کە لەگەڵ تۆ دەستم پێکرد.

❊ ❊ ❊

بەڵێنیان پێ مەدەن، متمانەیان پێ بدەن، ئیتر پێویست بە بەڵێن ناکات.

❊ ❊ ❊



تۆ زۆر لووتبەرزی، ئەم دونیایە شایانی ئەوە نییە، باوەڕم پێ بکە.

❊ ❊ ❊

دڵی من کە تۆی دەوێت بەبێ بینین، چۆن بەرگە دەگرێت کە دەیبینم.

❊ ❊ ❊

ئەو کەسەی دەستی لەسەر دەرگاکەیە بڕوات، ناچاری نەکەیت بمێنێتەوە.

❊ ❊ ❊

با هەموو ئەم شتانە تەواو بێ،
من و تۆ لە قەراغی دەریایەک
دائەنیشین جگەرەکانمان
ئەسوتێنین.



* * *

هەرگیز ئەو کەسە لەبیر ناکەم کە دەستی گرتم، وە ئەو کەسەشی کە زۆر پێویستم پێی بوو دەستی بەردام.

* * *

کاتێک تەنانەت بۆ یەک چرکەش قەرەبوو نییە، من ساڵەکانی تەمەنم لەتۆدا بەفیرۆ دا.

* * *

بێگومان ڕوو نادات، چونکە ئەوە خەونی ئێمە بوو.

* * *



دڵت ئاگری پێوەیە، بەڵام هێشتا سەرمامە.

* * *

ئەوەی ئەیەوێت ڕێگاکەت ئەدۆزێتەوە،
ئەوەشی نایەوێ بەهانەی حازرە، ئەویش ئەوەیە
کە ڕێگاکەت ونە.

* * *

ئەوەی پێتی ئەبەخشن نرخی بزانن و بێ منەتی
مەکەن، ئەوانی دیکە خۆیان چارەسەر ئەبن.

* * *

ئەو شتانەی بەباشی ئەڕۆن لە
ژیانت یەک نهێنی هەیە، ئەویش
ئەوەیە کە بەکەسی نەڵێی.

* * *



بووم بە مرۆڤێکی وەک سەهۆڵ سارد، هەست بە هیچ ناکەم.

****

هەوڵ مەدە، جیهان شوێنێک نییە بۆ ڕزگاربوون.

****

وێنە ڕەش و سپییەکان، گۆرانییە کۆنەکان، وە کۆنیش بێ خاوەنەکانیان کۆن نین، با بیزانی شتە کۆنەکان جوان بوون.

****



بووین بە خۆڵەمێش، چیتر چۆن سوتاین هیچ گرنگییەکی نیە.

****

مارکەی هەر ئینسانێک ویژدانیەتی.

❊ ❊ ❊

ڕۆژانێکم هەبوو کە تامەزرۆی شتانێک بووم، بیری ئەو ڕۆژانە دەکەمەوە.

❊ ❊ ❊

گەر گوێ لەو شتانە بگری کە کەسێک ئەیەوێ پێت بڵێ ئەبیتە کەسێکی باش، هەمووی ئەوەندەیە.

❊ ❊ ❊



مـردن هـەیـە و تـۆش پێت وایـە لـە هـەمـوو شـتـەکـان ئـەتـوانـی بگەڕێیتەوە.

❊ ❊ ❊

ئەوەی ئێستا وازم لێ هێناوە و گرنگی پێ نادەم ڕۆژانێک زۆر گرنگیم پێ دەدا.

* * *

ئەوانـەی لـەیـەک تـوڕە بـوون ئاشت دەبـنـەوە، ئەوانـەشـی مـردن بـەیـەک شـاد ئەبـنـەوە، بـەڵام مەسەلەکەی من زۆر جیاوازترە لەوانە.

* * *

کەسانێکی زۆر دەناسی، بەڵام بێ کەسیت.

* * *



کەسانێکی زۆر ڕۆیشتن، بەڵام هیچمان لێ کەم نەبوویەوە.

* * *

پێیان دەڵێی تێپەڕی و تەواو بووە، بەڵام جگە لە خۆت کەس نازانێ کە هەرگیز تێنەپەڕیوە.

❋ ❋ ❋

تەنانەت نەمتوانی وەک یادەوەرییەکی باش بمێنمەوە.

❋ ❋ ❋

پێموابوو دیارییەکە پێم دراوە، نەمزانی تاقیکردنەوەیە.

❋ ❋ ❋

وەک ئەوە وایە ئەو شتە لەدەست بدەم، تەنها لەبەر ئەوەی گرنگی پێدەدەم.

❋ ❋ ❋



ئەوەی شتەکان بە باشی ئەڕۆن نهێنیەکی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هیچ شتێک بە کەس نەڵێی.

* * *

خەتای تۆ نییە من بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتم کە سور دەمزانی داخراوە.

* * *

گەر تۆ بڕۆی منیش زۆر نامێنمەوە.

* * *

تکایە بمانبورن، ئیتر گیانمان قیمەتی هەیە، ئێستا عاقڵ بووین.

* * *



ئیمە تەنها دوو کەسین، کەچی ناتوانین بچینە ناو ژیانی یەکترەوە و ناشتوانین لێی دەربچین.

❊ ❊ ❊

کۆتاییمان هات، تۆ هێشتاش هەست بەوە ناکەی.

❊ ❊ ❊

ئەگەر شتێکی تریش هەبێت ماڵئاواییمان لەویش کرد.

❊ ❊ ❊

مـن خـۆم بـریـنـەکـانـی خـۆمـم چارەسـەر کـرد، لەکاتێکدا کەس دەرمانی دەردی خۆی ناکات.

❊ ❊ ❊



بینیم ئەو دیوارانەی کە پشتم پێ دەبەستن وا دەڕوخێن بەسەرمدا.

* * *

دڵیانمان نەشکاند، وایانزانی ئێمە ئەترسین.

* * *

دڵنیات ئەکەمەوە زۆر شت هەیە زۆر قورسە لەسەرم، بەڵام بگرە تاقەتیشم نیە لەگەڵ خۆما قسە بکەم.

* * *

پێویست ناکات کامڵ بیت، تەنها ساختە مەبن بەسە.

* * *



ڕێگایەک ئەدۆزینەوە پێکەوە، وەک چۆن پێشتر دۆزیمانەوە.

* * *

زۆر متمانەیان پێ مەکە، زۆر خۆشت نەوێن، زۆر ئومێدت پێیان نەبێت، چونکە ئەو زۆرانە زۆر ئازارت ئەیەن.

* * *

کاتێک ئەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەکەت، ئەو کاتە تێ ئەگەیت وازهێنان لە ماڵەکەت چەند قورسە، ئەمانە ژیان فێرت ئەکات.

* * *

من ئەو پارچە ونبووە بووم کە نەتتوانی بیدۆزیتەوە، کاتێک ویستت ئەو شتانە هەڵبگریت کە لەناوت بردوون.

* * *



خۆی لە ڕاستیدا ئەوەی هی تۆیە، قەت ناچێتە لای کەسی تر.

* * *

هـەموو شـەوێک یادگارییەکانت بە مێشکمدا دەڕوات.

* * *

گوڵەکەمان پێش ئەوەی گوڵ بکات وشک بووەوە.

* * *

ڕقم لە هەموو ئەو کەسانەیە کە ئەخلاقیان ئەفرۆشن.

* * *



کەمێک سەرسوڕهێنەر بوو بۆ من کە تۆ سەرکەوتیت، لەکاتێکدا من لەگەڵ خۆم شەڕم دەکرد.

*** 

زۆر لە کۆنا مایتەوە، بەڵام هێشتا وەک ئەوەیە دوێنێ بووبێ.

*** 

ئەگەر لە دوای ئەم ساتەوە دڵخۆش بین، ناتوانین خۆمان بگونجێنین.

*** 

ئەگەر واز لە خۆم بێنم ئەبێ زۆر شت لە تۆ ببەم.

*** 



جگەرە ئەبێتە هۆی کوشتنت، تەبعەن ئەگەر بژیت.

❋ ❋ ❋

ئـەم شـارە منی خۆشـناوێ، بـەڵام زۆر چاک ئەمناسێ.

❋ ❋ ❋

ئێمە سێ بۆ چوار هاوڕێمان هەیە، ئەوانی تر تەنها ئەیانناسین.

❋ ❋ ❋

ئـەو ڕۆژەی واز لـەو شوێنە ئەهێنیت و جێی ئەهێڵی کە زۆرترین متمانەت پێیەتی، تێدەگەیت.

❋ ❋ ❋



دڵ ئەیویست بـەم شێوەیە نەبێت، بـەڵام خۆ زۆربەی ئەو شتانەی دڵ ئەیەوێ نابێت.

* * *

ژیانێکم نیە هــەوراز و نشێوی تیابێ، تەنها دابەزینی تیایە.

* * *

لـەو ڕێگایە شوێنـەواری منی تیایە ناتوانی بیسڕیتەوە.

* * *

من ئەزانم تۆم بۆ نابێت،
بـەڵام دڵیشم کەسی دیکەی پێ قبوڵ ناکرێ.

* * *



لە ژیانمدا یەکێک لەو شتانەی فێری بووم ئەوەیە کە ئەوانەی لە کۆندا هەبوون بیریان ئەکەی، بەڵام دووبارە نایەنەوە ژیان.

* * *

کاتێک کەسی بەرامبەر بڕیاری ڕۆیشتن دەدات، مەحاڵە بگات بە خۆشەویستی.

* * *

گەر بیرەوەرییەکی باشت هەبێ، زۆرجار زەرەرت لێ ئەدات.

* * *

کاتێک ڕائەکەم هەر دەگەمەوە بە تۆ.

* * *



گەر ڕێگاکان بگەنەوە لای تۆ، من لەسەر ڕێگاکان لاناچم.

* * *

ڕێگایە ...

دەیبڕیت

مەودایە....

تێی ئەپەڕێنیت

کێشەیە...

. چارەسەر ئەکرێت

برینە....

سارێژ ئەبێت

مرۆڤ بەهەر شێوەیەک بێ ئەتوانێ کێشەکان چارەسەر بکات، جگە لە دوو شت نەبێت؛ مردن و خۆشەویستی. مرۆڤ ئەوەندەی ئەتوانێ هەوڵ دەدات، تەنها ناتوانێ ئەو دوو شتە چارە بکات.

* * *



تۆ بە ڕۆژە خۆرەتاوەکان ڕاهاتووی، منیش بە کاتژمێر چواری شەو.

* * *

هەرگیز هیوای کەسێک لەناو مەبەن، لەوانەیە تاکە شت بێت کە هەیەتی.

* * *

تۆ بە زەردەخەنەکەت وێنەیەکی ڕەش و سپی ڕەنگ دەکەیت.

* * *

من بۆ ئەوەی بڕوا بەتۆ بکەم لەگەڵ خۆما درۆم کرد.

* * *



هەر شتێک کە زۆر ویستمان، ئەڵێی بەڵێنی داوە کە نەبێت.

* * *

تێگەیشتم لە دونیا ڕۆژە تایبەتەکان نین، ساتە تایبەتەکان هەیە، کە ئەویش تۆ هەڵی نابژێری.

* * *

لەبەر ئەوەی درۆت لەگەڵ کردم بێتاقەت نیم، لەبەر ئەوەی لە دوای ئەوەوە چیتر بڕوات پێ ناکەم بێتاقەتم.

* * *



ئەگەر لە نێوان من و کەسێکی تر ویستت هەڵبژاردن بکەیت، ئەوە من هەڵمەبژێرە.

* * *

با حەقیقەت ئازارت بدات، لەبری ئەوەی درۆ دڵنەواییت بکات.

* * *

هەموو شتێک وەک گاڵتە وایە، بەڵام نامانخەنە پێکەنین.

* * *



گەر بڵێی دەرفەتێکی ترمان هەیە، من وازم لە دەرفەتیش هێناوە.

* * *

لەم دونیایە مرۆڤ یەکجار لەبەر کەسێک دوا ئەکەوێ، وە چیتر لەپێناو کەس پەلە ناکات.

* * *

جیاوازیت نەبوو، من جیاواز سەیرم کردی.

* * *

هەموو ئیشێک کە لە نیوە تەواو ئەبێت شوێنەوار جێ ئەهێڵێ.

* * *



ئەوانەی گوتیان ئەڕۆین گوتمان بوەستن، ڕێگا دیارە، بەویستی دڵتان بکەن.

* * *

من هەرگیز لە ڕقـەوە تووشی کێشە نەبووم، هەرچییەک ڕوویدا لە خۆشەویستیەوە بوو.

* * *

ئەگەر شوێنی خۆتت لە مندا بزانیبایە، جێگەی خۆت لە هەموو کەسێکی تردا بە سەیر و نامۆ دەزانی.

* * *



پێویستم بە کەسێکە هیچ نەگۆڕێت.

*** 

ئەوانەی باسی عەشقمان بۆ ئەکەن، خۆیان لە عەشق دۆڕاون.

*** 

ئێمە هەمیشە هەبووین، بەس تۆ کاتێ ئیشت پێمان بوو بیرت ئەکەوێتەوە.

*** 

خەیاڵەکانمان زۆر جوان بوو، گەر ژیابایین.

*** 



کەسێک زۆر ئازاری دام، بەلام چەقۆکە خۆم پێمدا.

* * *

بەڵێ، ئەو گۆرانیە هەموو ئازارەکانم دەزانێ.

* * *

هەندێک جار ئازارت دەدات بزانیت، دەڵێیت باشترە نەزانیت.

* * *

یەکێک بناسە کە لە لەدەست دانت بترسێ.

* * *



ئەوەی سوتا دڵی من نەبوو،ماڵی تۆ بوو.

*** 

کۆتایی چیرۆکەکە ئەزانین، بەس هەندێ جار مرۆڤ دەیەوێ ئەو هەڵەیە ڕووبدات.

*** 

لەو شوێنەی گوتت کۆتایی دێ، چیرۆکەکەت دەست پێ ئەکات.

*** 

گەر بژیت لە ڕابردوودا هەمیشە نەفرەت لە داهاتوو ئەکەیت.

*** 



باشترین شتەکان مرۆڤ ناتوانێ وێلیان بکات، چونکە بەدەستی خۆی نیە، ئەوکاتە لە چاوەڕوانیدا نامێنێ کە ڕای وایە نایەنە دی، وە گەر بێنە دی ئەو گرنگی و نرخەیان نیە کە پێشوتر هەیان بوو، چونکە گەر بە هەمان شێوە بوایە چاوەڕوانی بۆ ئەکرا.

* * *

هەرگیز بەهۆی دوورییەوە نامرێ،
بەڵکو بەهۆی گومانەوە دەمرێ.

* * *

ژیان درۆیەکە کە باوەڕمان پێ کردوە، مردنیش ڕاستییەکە کە فەرامۆشمان کردوە.

* * *



مرۆڤ کاتێک دەژی سەربەستە، باش نزیک بوومەتەوە وادێم، هەموو مرۆڤێک کەمێک مردووە، ئێمەش کەمێک مردووین، مردوەکانیش ڕۆژێک دەنێژرێن، ئەو مردووەی لە ناخماندایە....
لە دەروونماندایە...
ڕۆژێک هەر دەنێژرێت.

* * *

چارەنوسمان لەناو لەپی دەستمان نوسراوە،
ئەزانیت بۆ؟
بۆ ئەوەی هەرکاتێک ویستمان بیشارینەوە،
چونکە هێز لە شاردنەوەدایە.

* * *

لەو کەسانە نیم لەو شوێنەی وازت لێ هێنام بمدۆزیتەوە.

* * *



من تازە دیوارێکی باشم دروست کردووە، کەس ناتوانێت بێتە ژوورەوە،وە خۆشم ناتوانم لێی دەرچم.

*** 

بینیوتە ڕەشەبا چی لە دارەکان ئەکات هاوڕێ؟

***

لەمەودوا ببورن، چونکە ئیتر بە ئەنقەست و بە ویست شتەکان ڕوو ئەدات.

***



هەزار چەقۆ چوو بە پشتما، هەر هەزار دانەکەم دەرهێنا، بەڵام تەنها بۆ یەکێکیان دەستم دەلەرزی.

***

ئێستا ڕێگاکەی من بۆتۆ تەسکە، کۆلانەکەی تۆ ناتوانێ بێتە ناوی.

* * *

بێتاقەتت ئەکەن، زۆر بێتاقەتت ئەکەن، ئەوکاتە ئیتر من دێم بە عەقڵتا.

* * *

بەڵکو لە دونیاکەی تر...

* * *

کوا ئەو خۆشییەی کە باسی دەکەین؟

* * *



ئەوەندە سەیری دواوە مەکە، بۆ ئەو ڕێگایە نارۆین.

* * *

هەرچەنێک باشبین لە چیرۆکی یەکێکدا خراپین.

* * *

هەموو ئەو شتانەی بێدەنگ بووم تیایاندا لە مێشکم دا هاوار ئەکەن.

* * *

ئەم ژیانە تۆش ئەسڕێتەوە.

* * *



ئەگەر بمانزانیایە قسەکانمان چی جیاوازییەک دروست ئەکەن ئەوە هەرگیز قسەمان نە ئەکرد.

* * *

من تەنها هەڵە بووم، شکستم نەهێناوە.

* * *

کاتێک کە ماڵئاواییەک دێت بۆت، هەموو سڵاوەکانت بیر ئەچێتەوە.

* * *

ئەمەوێ کە لە خەو هەستام ببم بە تۆ.

* * *



تا دیمەوە سەرخۆم ڕۆژەکان تەواو ئەبێت.

*** 

هەتا ئەتوانن ڕقتان لێیان بێ، هیچ نیەتێکی خۆشویستنمان نیە.

***

هەمووان دوای ڕووداوەکانن، کەس گرنگی بە هەستەکان نادات.

***

تۆ پاڵەوانی هەموو شتێکیت کە سەرکۆنەی دەکەیت.

***



ئێمە لەگەڵ کەسدا نەبووین و لەگەڵ کەسدا نامێنین، هەمووان ئاسوودە بن.

* * *

وازم لە هاوسۆزی هێنا، شەرم دەکەم خۆم بخەمە جێگای تۆوە.

* * *

هەستەکانت بەو شێوە نەبوون، چاوەڕێی چی بوویت و چۆن دۆڕای.

* * *

لەوانەیە ڕۆژێک بتدۆزنەوە،
ئەوکاتە یان پەشیمانن،
یان وەک دوژمنت هاتوون.

* * *



تەنیاحاجی

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن "هەمیشە جەبار" کراوە**

**بە pdf و پێشکەش بە خوێنەران کراوە**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22



t.me/tanyahaji7